# گەشتی ژیان

## چەند ڕێنماییەکی کورت بۆ حاجیانی ماڵی خوا

احمد مەلا عثمان

هەولێر /١٤٢٤ کۆچی - ٢٠٠٣ ز

لبيك اللهم لبيك لبيك لاشريك لك لبيك
إن الحمد والنعمة لك والملك لاشريك لك



# گەشتی ژیان

# مەناسیکی حەج بە کوردی

سەرچاوەکان

- قورئانی پیرۆز
- وتە شیرینەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) .
- مناسك الحج ( وزارة الاوقاف العراقية ) .
- مناسك الحج ( رابطة العالم الاسلامي )
- ئەوەی خۆم بینیم لەم سەفەرە پیرۆزەدا .
- کاسێت و سی دی لە سەر حەج و عومرە .
- لە ئەنتەرنێت .

ژمارەی سپاردن لە وەزارەتی رۆشنبیری ( ٢٦٣ ) ٢٠٠٣
چاپخانەی منارە / هەولێر

بسم الله الرحمن الرحيم

رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلَاةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ (ابراهيم ٤٠)

## پێش کەش

پاداشتی ئەم نوسراوە پێش کەشە

بۆ دایك و باوکی خۆشەویستم

خوای گەورە لێیان خۆشبیت و بە بەهەشتی پان و بەرین شادیان بکات

هەروەها بۆ ئەو موسولمانانەی دەیانەوێت

گەشتی حەج و عومرە ئەنجام بدەن

حاجی احمد

ئەیلول / ٢٠٠٢

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على خير خلقه سيدنا محمد وعلى آلة وصحبه أجمعين .

دوای ئەوەی نامیلکەی ( گەشتی ژیان )کەلە لایەن کاك ( احمد مه لا عثمان ) ئامادە کراوە ، خوێندرایەتەوە ، پەسند کرا، بە هیوای ئەوەی موسولمانانی کورد لە کاتی ئەنجام دانی مناسکی حەجدا سودی لیٚ وەرگرن .

لەگەلٚ ڕێزماندا



مەکتەبی تەنفیزی

یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی

کوردستان

هەولێر ٢٢/ ٩ / ٢٠٠٣

بسم الله الرحمن الرحيم

وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلاً

( آل عمران ۹۷ )

# پێشەکی

حەج کردن : گەورەترین و پیرۆزترین گەشتی ژیانە ، جوانترین چرکەکانی تەمەنە لەبیر ناکرێ ، خۆشترین ماندوبوونە، چاکترین توێشووی بەرز بوونەوەی ئیمانە، باشترین هۆکارە بۆ فێربوونی ئارام گرتن (الصبر ) ، دروسترین سەفەرە پڕ لە حیکمەت و خێرو بەرەکەت .

شای سەفەرانە ... .

برایان و خوشکانی موسلمان ، حەج پێنجەمین بنچینەکانی ئیسلامە و شەرتەکانی واجب بوونی ئەمانەن :

(الا سلام ) (والعقل ) ژیری ( والبلوغ ) تەکلیفی شەرعی لەسەر بێت ( والحرية ) ئازاد بێت (والاستطاعة) توانای مالی و بەدەنی هەبێت کە ئەمانە دەگرێتەوە: تەندروستی باش بێت و ڕێگا ترسناك نەبێت و خەرجی هاتوو چۆو و ماڵ و منالی هەبێت تا گەڕانەوە (وتسافرالمرأة مع ذي المحرَم ) پێویستە ئافرەت لەگەل پیاوەکەی بڕوا یان لەگەل یەکێ دەست نوێژی لێ نەشکێ ، خوای گەورە لەژیاندا یەك جار حەجی فەرز کردووە

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ ( الحَجُّ مرَّة فمن زاد فهو تطوع ).

بۆیە زۆر گرنگە زانیاریت هەبێت دەربارەی حەج وعومـرە بـۆ ئەوەی توشی هەڵەنەبیت و ، پارەو ماندوبوونت هەروا نـەڕوا ، لەکاتی سەفەرم بۆ ئەم ڕێگایە پیرۆزە لەساڵی ٢٠٠٢ بەداخەوە هەندێ لە خوشك و برا حاجیەکانمان هەڵـەیان کـردووە لەبـەر ئەوەی بێ زانیاری ڕێگای حەجیان گرتووە و لـەو کـاتیش لـە زانایەکیان نەپرسیووە ، بۆیە هەر لەو کاتـەوە لـە بـیری ئـەوە بووم نوسینێکی ئاسایی کورت بنوســم ، بۆ ئـەوەی خوشـك و برای حاجی پێش سەفەرەکە چەند جار بیخوێنیتەوە تا بزانـێ بۆ کوێ دەچی و چی دەکـات ، بـەهیوای ئـەوە دوورکەونـەوە لەهەڵـەکان لـەکاتی ئـەنجام دانـی ڕوکـن و واجبـەکانی حــەج و عومرە . هەر چەندە نوسینی کوردی هەیە لەسەر حەج بـەڵام لەم نوسراوەدا زیاتر مەبەستم باسی خۆ ئامادە کردنی پێـش سەفەرەکە و کاتی گەڕانەوەو ئــەو کـەل و پەلانـەی پێویسـتە لەم سەفەرەدا ، هەروەها باسی ڕێگاو ئـەو شـوێنە پیرۆزانـەی بۆی دەچــی و جیـاوازی نێوانیـان . داواکـارم لـەخوای گـەورە زانیارییمـان پـێ ببەخشـێت و کـارە چاکـەکانمان وەربگـرێ و لەخراپەکانمان خۆشبێت ئامین

نـوسـەر

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين القائل :

( وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَنْ لاَ تُشْرِكْ بِي شَيْئًا وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ)( الحَج ٢٦)

والصلاة والسلام على نبينا محمد القائل : من ملك زاداً وراحلةً تَبلُغُه إلى بيت الله ولم َيحج فلا عليه أن يموت يهودياً أو نصرانيا ً ( صدق رسول الله ) اللهم صلّ على سيدنا محمد طبِّ القلوب ودوائها وعافية الابدان وشفائها ونور الابصار وضيائها وعلى آله وصحبه الى يوم الدين. ( رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالإِيمَانِ وَلاَ تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلاًّ لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيم ) .

اللهم لك أسلمتُ وبك آمنتُ وعليك توكلتُ وإليك أنبتُ وبك خاصمتُ وإليك حاكمتُ فاغفر لي ماقدّمتُ وما أخّرتُ وما أسرَرْت وما أعلَنْتُ وما أنت أعلم به منّي أنت المُقَدِّمُ وأنتَ المؤخِّر لا إلهَ إلاّ أنت،

اللهم اغفر لي خَطيئتي وجَهلي وإسرافي في أمري اللهم اغفر لي جِدّي وهَزلي وخَطئي وعَمدي وكل ذلك عندي أما بعد :

السلام عليكم ورحمة الله و بركاته

**یەکەم : خۆ ئامادە کردن :**

پێویستە لەسەر خوشك و برای حاجی لەم سەفەرە پیرۆزەدا بە تەواوی خۆی ئامادە بکات و لە شوێنە پیرۆزەکان عیبرەت وەربگرێو فەلسەفەی حەج فێربێو ئیمانەکەی بجولێو بەرزبێتەوە، لەکاتی گەڕانەوە پێیەوە دیار بێ .

خۆ ئامادە کردنەکە بەم شێوەی خوارەوە بێت :

١- خۆ ئامادە کردن پێش سەفەر :

پێویستە لەسەر خوشك وبرا حاجیەکان بۆ ماوەیەکی زۆر پێش سەفەر کردن تەوبەیەکی نەصوح بکەن خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (النور:٣١)﴾

بزانە تۆ دەتوانی ئەم تەوبەیە ڕابگری ئینجا سەفەربکە : مەلێن با ئێستا بەردەوام بم لەگوناهان خۆ نەچومە بۆ حەج یان بلێی کاتی ئەوە ماوە تۆبە بکەم ، بەڕاستی ئەمە ئەو پەڕی نەزانین و نەفامیو بێعەقلیە، تا زووە فریای خۆت کەوە و بۆلای خوای گەورە بگەڕێوە ، ماڵ و سامان و ژن و منداڵ پاش مردنت هیچت بۆ ناکەن .

بەڕێز مامۆستا مەلا عوسمانی باوکم غەریقی ڕەحمەتی خوای گەورە بێ ، لە پارچە شیعرێکی باسی دونیا دەکاو دەڵێ :

برایان زۆر تالیب نەبین ئێمە بۆ دینار
دوو حەرفی ئەووەل فڕێدە لێن ئەبێ بە نار
هیچ تالیب نەبین ئێمە بۆ دەرهەم
دوو حەرفی ئەووەل فڕێدە لێن ئەبێ بە غەم

هەروەها ئامادەکردنی ماڵێکی حەلاڵ و، دوور کەوتنەوە لەهەموو تاوانێك ، داوای کەردن ئازادی لەو کەسەی ئازارت داوە یان ماڵت خواردووە گەڕاندنەوەی قەرز یان مۆڵەت وەرگرتن لەخاوەن قەرزەکە و نوسینی قەرزەکانی لای خەلك ، هەروەها وەصیەت کردن بۆ ماڵ و مناڵ بە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوای گەورە، زیاتر نزیك بوونەوە لە خوای گەورە بەنوێژوو ڕۆژوو و بەخشین و صەدەقەو کاریچاکە، کە دەفەرموێ:

( وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِي يَاأُولِي الأَلْبَابِ )
البقرة١٩٧،

لەگەڵ هاوەڵی شارەزاو دیندار بکەوە ڕێ ، کەلەماڵ دەردەچی بەڕاستی مردنت بێتەوە یاد ، بەنیەتیحەج وعومرە و یەك لابوونەوە بۆ خوای گەورەو دوور لە ڕیاو خۆهەلکێشان،

بە دەست و دڵی فراوانەوە هەوڵ بدە خزمەتی هاوەڵانت بکەیت، حاجی بەپارەی گیرفانی،کە خوای گەورە پێی بەخشیوە کە تا ئێستا توند گرتبویەو لەدڵیبوو ئێستا ئەوپارەی خستووتە سەردەستی بۆ خوا ، ماڵ و سامان و وولات و کەس وکارو دایك و باوك و منداڵ و ژن و دوکان و وەزیفە و پیشەو بازاڕ و عەزیزانی بەجێ دێلی بۆ ئەم سەفەرە، هەموو گیانی دیوی ناوەوەو دیوی دەرەوەی تیا بەشدارە، پارەو ماڵ و ساما نی لاشەی گشتی تیا بەشدارە ، زۆر لە گەرم و گوڕیدایە سەفەرێکە بۆ مەدینەی پیرۆز خێری نوێژێك بە (١٠٠٠ ) هەزار نوێژە ، خێری دینارێك بە هەزار دینارە، سەفەرێکە بۆ مەککەی پیرۆز خێری نوێژێك بە(١٠٠ ٠٠٠ ) سەد هەزار نوێژە خێری دینارێك بە سەد هەزار دینارە ، سەیری ئەو خێرە ئەو بەرەکەتە ئەو ڕەحمەتە بکەن، چۆن موسوڵمانان بۆی شەیدا نەبن و بۆی گەرم و گوڕ نەبن ( وَعَجِلْتُ إِلَيْكَ رَبِّ لِتَرْضَى )(طه ٨٤) بەڕاستی جێی خۆیەتی خۆت و ماڵ و سامانت و هەرچی هەیە بکەیە قوربانی ئەم سەفەرە .

ئەگەر ماڵت بۆ ئەم سەفەرە خەرج نەکەی ، بۆ چی خەرجی دەکەی ؟ بۆ ئەوروپا ، بۆ شوینی تر ، کە بەپارەی خۆت

گوناهو بێدینی پێ دەکرێ، یانی ئاگری دۆزەخی پێ دەکرێ، بۆ کەس و کارت بە دیاری دەینی‌یەوە.

٢- چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لە ڕێگا :

پێویستە لە ڕێگا خۆت بپارێزی لە غەیبەت و نەزەر و تێکەڵاوی پیاو و ژن و دەنگ بەرز کردنەوە و تووڕەبوون و جنێو دان و شەڕە قسە، هەروەها بە بەردەوامی لە هەموو شوێنێك و سات و کاتێك دا بەم شێوەیە بیت ، چاو بپۆشە لەو خراپانەی لەگەڵت دەکرێ ، خوای گەورە دەفەرموێ :

( الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلاَ رَفَثَ وَلاَ فُسُوقَ وَلاَ جِدَالَ فِي الْحَجِّ ) البقرة١٩٧.

بیر لە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەوە ، ئەو جا دەزانی تۆمەڵەی کە لەسەر شوێن گرتنی کورسی ناو سەیارە شەڕە قسە دەکەی ، یان بە دەیەها شتی تر کە شەیتان بۆت دەڕازێنێتەوە .

موسوڵمانان چەند نەرم و نیان ولەسەرخۆ و بێدەنگ بن لەخوای گەورە نزیکترن ، بۆیە زۆر ئاگات لە ئیمانەکەت بێت ، هەوڵ بدە گشت نوێژەکان بەجەماعەت بکەی و برا حاجیەکانیش ماندە لەگەڵ خۆت ، نوێژ ئاخر وەصیەتی پێغەمبەرە(صلی الله علیه وسلم)، هەرکارێکی خێر لەوە خێر

تر نی‌یە نوێژ لەکاتی خۆی بکەی و بەتایبەتی بە جەماعـەتیش بیکەی .

پیـاو چاکـان فەرموویانـە ئەگـەر بتـەوێ قسـە لەگـەڵ خوایگـەورە بکـەی هەسـتە دەست نوێژێکی پوخـت بشـۆ و نوێـژ بکە ، ئەگـەر بتـەوێ خـوای گـەورە قسـەت بـۆ بکـات قـورئان بخوێنـە .

سەفرێکـە شـایەنی ئەوەیـە خـۆت بـۆ غـەریب بکـەی بـەبێ کەسی جانتا وکەل وپـەلی سـەفەر هـەڵگری و بـۆی مـاندووبی، بۆی برسی‌و تێنووبی ، بۆ خوا بۆ بەرزبونەوەی ووشەی ( لا الە الاالله ) .

لەو سەفەرە مـەعدەنی مرۆڤ دەردەکـەوێ ، چـەند تورەیـە چەند بە ئارام و لەسەر خۆیە چەند لێبووردەیە چەند یارمـەتی خەلك دەدات و دەبەخشێ، چەند دەتوانی ماڵی خۆت بکەی بە قوربانی خەلك، چەند دەتوانی خزمەتی حاجیان بکەی، چـەند زیری چەند لەگەڵ خەلك گفتووگۆت خۆشە، ئەو هەموو هەلس و کەوتـە بەکەشیدەو بـە تەسبێح بـەدیار ناکـەوێ تەنـها لـە سەفەر بە دیار دەکەوێ .

لە رێگایەکی دوورو درێژ لـە شـوێنێك بـۆ شـوێنێکی تـر شـەو نخونی بێنان و بێئاو برسـێتی تێنوێتـی جانتـاو کـەل وپـەل

هەلگرتن ، شتێك هەڵدەگری ئەویتریان دەکەویَ کەس نی یە یارمەتیت بدات ، هەر کەس غەمی هەلگرتنی کەل و پەلی خۆیەتی ، ئەگەر چاوەڕێی یارمەتی بیت لە حاجی یەکی هاوەڵت ، سەیر دەکەی ئەویش لە تۆ باشتر نی یە ،بەڕاستی هەر لە قیامەت دەچیَ ، قیامەت و حەج لەیەك دەچن ، خوای گەورە لەسەرەتای سورەتی حەج باسی قیامەت دەکا دەفەرمویَ :

(يَاأَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ (الحج ١))

ئینجا ئەگەر لە حەج سەرکەوتی لەو ماندو بوونەو لەو بیَکەسی یە سەرکەوتیو ئا لێرە تورەنەبوویو سوپاسی خوای گەورەت کرد ،یەکسەر بزانە لەقیامەتیش سەر دەکەوی .

ئایادەتوانی بەم دلە پڕ لەئیمانەوە و بەم شێوەیە سەفەر بکەی؟ یان بەپێچەوانەوە خوانەخواستە ! .

٣- هەلویستی حاجی لە شاری مەدینەی پیرۆز :

لەڕێگایەکی دوورو درێژ دەڕۆی بەرەو شاری مەدینەی پیرۆز بەنیەتی نوێژکردن لە مزگەوتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) کە دەفەرمویَ :

(لاتشد الرِّحالُ إلاّ إلى ثلاثةِ مساجد: مسجدي هذا ، والمسجد الحرام ، والمسجد الاقصى ) ( رواه البخاري والمسلم )

له (مدينة الحجــاج ) دادەبــەزی ، گۆڕەپــانێکی گەورەیــە تایبەتە بۆ نیشتەجێی حاجیان ، کاتــی یە ،

کاتێ گەیشتیتە مزگەوتی پێغەمبەر (صلــی الله علـیه وسـلم ) دوورکعات نوێژێکە ، ئەگەر بۆت کرا بچۆ بەرامبەر مینبەرەکــەو میحرابەکەی پێغەمبەر (صلی الله علیــه وسـلم) نوێژەکـە بکـە ، کە ڕەوزەی پیرۆزە، لەو شوینە سـوجدە بـۆ خـوا دەبـەی کـە شـوینی سـوجدەی پێغەمبــەرو هاوەڵــە بەڕێزەکانــە ، نێــوان مینبەرەکەو ماڵەکەی ( ئێستا دەکا قەبرەکەی صلـیالله علیـه وسلم ) ڕەوزەی پیرۆزە کە مێرگێکـە لـەمێرگێکی بەهەشـت ، پێغەمبەر (صلیالله علیه وسلم) دەفەرموی :

(مابین بـیتي ومنبري روضة من رياض الجنة ) ( متفق علیه ).

زۆر بەشەرمەوە بە ئەدەبەوە بە خەجالەتەوە برۆ خزمــەتی و کەلەبەردەم قەبرەکەیدا وەستایت و سەلامی لی بکـە ، وەك سەلامەکەی لەگەڵ ئەتتەحیات لەکاتی نوێژ دەیخوێنــی ، بـەڵام ئێستا بەرامبەری وەستای و سەلامی لێ دەکەی، دەڵێی

( السلام علیك أيها النبی ورحمه الله وبركاته )

هەروەها بە جۆری تر ناوی پیرۆزی بێنە لەگەڵ سەلامەکە.

ئەوکەسەی پێش سـەفەرەکە پێی ڕاسپاردی سـەلام لـە پێغەمبەری خوا بکە سەلامـەکە بگەیەنە بـە پێغەمبـەر(صلـی

الله عليه وسلم) ، هەروەها بزانە ئایا صەلآت و سەلامی تۆی پێدەگەیندرێت ؟ . ئایا شایانی ئەوەی و لەو کەسانەی پێغەمبەری خوا وەلآمی سەلامەکەت بداتەوە .

کەمێك بەرەو دەستە ڕاست برۆ سەلام لەهەردوو هاوەڵە بەرێزەکەی پێغەمبەر بکە کەئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامیعومەرە لەوێ نێژراون (خوا لێیان ڕازی بێت) ، دەچییە خزمەت گۆڕستانی بەقیع زیاتر لە (١٠٠٠٠) دە هەزار هاوەڵانی پێغەمبەری لێیە گۆڕی ئیمامی عوسمانی لێیە، دەچییە سەردانی شەهیدانی ئوحود ، گۆڕی هەمزەی مامی پێغەمبەر و گۆڕی مەصعەبی کوڕی عومەیری لێیە ، یەکەم سەفیری ئیسلام بووە ، دەچییە سەردانی مزگەوتی قوبا کە یەکەم مزگەوتی ئیسلامە بەدەستی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بینا کراوە ، یەکەم دەوڵەتی ئیسلام لەو مزگەوتە دەستی پێکردووە، هەروەها ئەحکامەکان و دەستوری یەکسانی ئیسلام لەو مزگەوتە نازڵ بووە ، دەچییە سەردانی مزگەوتی قیبلەتین کە لەوێ قیبلە گۆڕاوە لە ( المسجدالاقصی ) بۆ کەعبەی پیرۆز .

ئینجا دەزانی ئەو پێغەمبەرە چەند هەوڵیداوە و ماندووبووە بۆ پاراستنی ئەم دینە، بۆ گەیاندنی ئەم دینە، دەزانی چەند

خزمەتی موسوڵمانانی کردووە چەند خزمەتی بەشەریەتی کردووە خوای گەورە دەربارەی دەفەرموێ ( وَمَا أرْسَلْنَاكَ إلاَّ رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ (الانبيا١٠٧)) بەڵێ پێغەمبەر رەحمەت بووە بۆ ئیماندارو کافرو دارو بەردو گیانلەبەرو دەشت و ئاوو ئاسمان و زەوی .

چەرخی زێرینی ئیسلام و خەلیفە راشیدینەکان بە ئیمان بەرزی و لەخواترسی موسوڵمانەکان بوو ، ئەگەر بمانەوێ وەکو ئەوان بەخۆشی بژین ئەو چەرخە زێرینە بگەرێنینەوە بۆ خۆمان، لە فەقیر، دەوڵەمەند ، مەسئوول و کاریەدەست ، تا پاشا، بێ ترس و لە ئاسایش بژین کەس زوڵم لەکەس نەکات و ستەمکار نەمینێ فەقیرو زگ برسی نەمینێ ، با بگەرێینەوە بۆ ئیسلام بۆ دینداری بۆ لای خوا .( فەرموو سیرەی ئەو پێغەمبەرە نازدارە بخوێنەوە) .

٤- حاجیو شاری مەککەی پیرۆزو :

حاجی بۆئەم سەفەرە بانگ کراوە لە لایەن شەیخی پێغەمبەران کە حەزرەتی ئیبراهیمە ، بەفەرمانی خوای گەورە بۆماڵی خوا ، بەو سامان وماڵەی خوای گەورە پێی بەخشیوە. بۆمێوانداری خوای گەورە کە دەفەرموێ :

﴿وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ(الحج٢٧)) .

ماڵیخوا یەکەمین ماڵە لەسەر زەوی بۆ خوا پەرستی، بۆ تەوحیدی خوا ، بۆ یەکتاپەرستی ، بۆنویێ کردنەوەی ئیمان ، بۆ گۆڕینی سلوك و ڕەفتارو ئەخلاقی بەرزو ڕەوشت و هەمووشتێك مان ، گشتی وەکو پێغەمەر و ئەصحابە بەڕێزەکان بێت ، خوای گەورە کە دەفەرموێ:

إِنَّ أَوَّلَ بَيْتٍ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكًا وَهُدًى لِلْعَالَمِينَ
آل عمران ٩٦

هەروەها کەیەکەم جار مەککەت لێ بە دیار دەکەوێ لە دایك بوونی پێغەمبەرت دێتەوە یاد ، چۆن وا بە بێ باوکی ، بێناز ، بەشوانی گەورە بوو ، گەورەبوو لای خوا ، لای خەڵك ، لای جوولەکەو گاور ، لای گشت کەسێ ، ئەگەر بیناسیبا و یان نەیناسیبا ، سەرەتاو سەرهەڵدان و بانگەوازی ئیسلامت دێتەوە یاد .

هەروەها کە یەکەم جار کەعبەی پیرۆزت لێ بە دیار دەکەوێ ئارامت نامینێو دەتەوێ زوو بیگەیێو لە باوەشی بکەی ،
لەو سات و کاتەدا پێغەمبەرت دێتەوە یاد کە چۆن خوای گەورە پەروەردەی کردووە لە سێبەری ئەو کەعبە پیرۆزەدا ،

به سەداها جار حەزرەتی جبریلی ناردووە بۆ لای و سەلامی بۆ ڕەوانە کردووە تا دڵی بداتەوە ، بەم شێوەیە پەروەردە بووە، بۆیە لە حەریی خەندەق لەگەڵ تیشکی ( بروسکی ) ئاگری دەستی ، کە بەردێکی لەت دەکرد تاقی کیسراو حەزارەتی یەمەنی دەدیت و مزگێنی فەتح کردنی بە موسوڵمانەکان ڕادەگەیاند .

هەروەها کە بەدەوری کەعبە دەسوڕێ یەوە ساڵەهای ساڵە شەیدای بە خزمەتی بگەی ، قاچت لە شوێنی قاچی پێغەمبەرو ئەصحابەکان دادەنێی ، لەگەڵ ملائیکەتان دەسوڕێ یەوە ئەوان لەئاسمانەوە بەدەوری ( بیت المعمور ) دەسوڕێنەوە ، بەیەك دەنگ پێکەوە دەڵێن ( لَبَّیكَ اللهُمَّ لَبَّیْكْ ، لَبَّیكَ لا شریك لكَ لَبَّیكْ ، إنَّ الحَمدَ والنِّعمة لَكَ وَالمُلكْ ، لا شَریكَ لَكْ ) ، ئینجا هەست دەکەی تۆ لەسەر زەوی نەمای بەرەو بەرزایی ئاسمانەکان دەڕۆی .

بەڕاستی لەم گەشتەدا هەست بە ئیمان بەرز بوونەوە دەکەی ، هەست دەکەی ئەوە میوانی خوای گەورەی ، هەست دەکەی ئەوە لەگەڵ خوای گەورە دەژی .

بۆیە زۆر حەز دەکەی بەو دڵە پڕ لە ئیمانەوە لەو شوێنە پیرۆزانە بەرەو خوای گەورە بگەڕێیەوەو بمری ، بەڵام

ئەگەر بە شەرع دروست با، هەر دوعای ئەو مردنەت دەكرد.

ئەگەر یەكێكی گەورە لەم دونیایە ، مەسئولێك ، داوەتت بكات چەندە دڵخۆش دەبی ، بەڵام ئەگەر خوای گەورە داوەتت بكات ئەوەی داوەت نامەكەت بۆ بێنی پێغەمبەری خوا بێ ، دەبێ چەند دڵ خۆشبێ و چەند بۆ ئەم داوەتە گەرمو گوڕ بێت .

كە دەستت بەرز دەكەیتەوە لەڕاستی بەردە ڕەشەكە، بەردی بەهەشتە ، لەئاوی زەم زەم دەخۆیەوە كە لەسەر چاوەكانی ئاوی بەهەشتە .

دەچی‌یە سەعی لە نێوان سەفاو مەروە ، سەعی یەعنی ڕۆیشتن و غاردان ، كەدووبارە كردنەوەی كاری ئەو ئافرەتەیە دایكی حەزرەتی اسماعیل كەخۆی بەخت كرد بۆ خاتری خوا بۆ كوڕەكەی و مێردەكەی كە پشتی بەخوا بەست لە زەوی‌یەكی ووشك و چۆل ڕای دەكرد بەدوای ئاو و ئاوەدانی بەو قەناعاتەی ، كە خوای گەورە فریای دەكەوێ ، خوای گەورە بۆمانی دەگێڕێتەوە (ربنا إني أسكنت من ذريتي بواد غير ذي زرع عند بيتك المحرم ربنا ليقيموا الصلاة ) (ابراهيم ٣٧) .

یەكسەر بۆ ئەم ئافرەتە ئیماندارە بەفەرمانی خوای گەورە لەو ووشكایەتی‌یە لەو چۆلەوانیە ئاو لەژێر قاچی حەزرەتی

اسماعیل دەرچوو کە ئەو کاتە کۆرپە بـوو ، بـووە ئـاوەدانی .
بزانـن هەرخوشـکێك یـان هـەر ئیمـانداریك وەك ئـــەم ئافرەتــە مسـولّمانە، وەك هاجـەرە پشـت بـەخوا ببەسـتێ و ئیمـــانی وا توندبیّو وا بەرز بیّ بە خـوا ، خـوای گـەورە زایـەعی ناکـات ، با مـێردی نـەبیّ ، بـاوك و بـراو کـەس و کـاری نـەبیّ ، خـــوای گەورە دەبێتە کەسی ، کاری گرانی بۆ ئاسان دەکات و مشـتە خۆڵی بۆ دەکاتە زێـڕ .

کاتیّ لە عەرەفات ڕادەوەستی ئەو هەموو موسولّمانەی لیّیە، بە سەدەها گەل و نەتەوە، بەسەدەها زمان ،کە بە هیچ جۆریّ لیّیان تیّناگـەی ، بـەدەیان ڕەنـگ و ڕوخســاری جیـا جیـا ، گشتیان وەك تۆ موسولمانن و شەیدای ئەم شوێنە پیرۆزانەن ، یەك جلیان پۆشیوە یەك داواکاریان هەیە لە خوای گـەورە کـە ئەم حەجەیان قبوولّ بکات و لیّیان خۆشبیّ ، ئەو ڕۆژە زۆر لە ڕۆژی قیامەت دەچـیّ ، ئینجـا دەزانـی گشـتی خوشـك و بـرای تـۆن ، واتـە تـۆ بـرای ملیـاریك و دوو ســـەدو پـەنجا ملیـۆن موسـلمانی لەجیـهاندا ، نموزەجـی هـەموو وولّـاتێك دەبینـــی، هەیە درێژە یان کورتە، سپییە یان ڕەشە ، دەولّەمـەندە یـان فـەقیرە، زانایـە لـە زانیـاری و تـەکنۆلۆجیا یـان نەزانـــەو هیــچ تیّناگا ، هەیە ساغە هەیە نەخۆشە.

ئەگەر حاجیەکی ڕەشی حەبەشی لاواز لەنزیکت دەست بە دوعا وەستابوو وەك تۆ فرمێسکی دەڕشت ، ئەو کاتە زۆر تر هەست بە برایەتی‌یەکە دەکەی .

ئێمەش بەر دوعای ئەوان دەکەوین و هاوبەشی خێریانین ، با وەفامان بێ بۆ ئەم دینە کە ئێمەی کردۆتە برا ، وەك خوای گەورە دەفەرموێ ( إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ ) الحجرات ١٠ .

ئەوەی لەنوێژا سەلامی بۆ دەنێری کە دەڵێ :

(السلام علينا وعلى عبادالله الصالحين ) ئێستا ڕوو بە ڕوو سەلامیان لێ دەکەی وبۆقەیان لەگەڵ دەکەی‌و وگشتیانت خۆش دەوێ .

ئەگەر غەمی ئەو هەموو خوشك و برایانەت لە دلا نەبێ ، ئەگەر غەمی ئیسلام و موسوڵمانانەت نەبێ ، دوعای خێریان بۆ نەکەی و هاوبەشی غەمیان نەبی‌و دەوری صالح بوون و ئاشتەوایی نێوانیان نەبی ، ئەگەر هەر غەمی پارەی ناو گیرفانت و غەمی بازاڕی خۆت بی .

بزانە هێشتا ماوتە ببی بەحاجی ، حەجێکی ترو چەند حەجی ترت پێویستە . لە هەر کوێ موسوڵمانان توشی زەحمەت و ناخۆشی و نەهامەتی بوون تۆ هەستت بجوڵێ‌و لە گەڵیان هاو بەش بی و ئەگەر هیچت بۆ ناکرێ خۆ دەتوانی

دوعای خێر بۆ ئەو هەموو موسوڵمانانە بکەی .

هەروەها شەو مانەوە لە موزدەلیفەو میناو شەیتان ڕەجم کردن و سەر قاچین و ئاژەل سەر بڕین ، گشت ئەو ماندوبوونە تەنها بۆ خوایەو بەفەرمانی خوا .

٥- کاتی تەوافی ماڵ ئاوایی‌وگەڕانەوە لە حەج :

حەج کردن ئاسانە بەلاَم ڕاگرتنی گرنگە ، نیشانەی حاجی تەواو پاش گەڕانەوەی لەحەج ئەوەیە لەجاران دیندارترو باشتر بێت ، ئیماندار بەحەج کردن لەهەموو گوناهان پاك دەبێتەوە ، پێغەمبەر ( صلی‌الله علیه وسلم ) دەفەرموێ :

(مَنْ حَجَّ لِلّهِ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَيَوْمِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ) رواه البخاري

کاتی گەڕانەوە بۆنی پێغەمبەرو ئەصحابە بەڕێزەکان لەگەڵ خۆت هەلگری ، بۆنی ئیمامی ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان و بۆنی ئوحودو بۆنی مەدینەو مەککەی پیرۆزو بۆنی کەعبەی ماڵی خوا لەگەڵ خۆت هەلگری و بینی‌یەوە، فێری عەقیدەو ویژدان و سلوك و ڕەفتارو ڕەوشت و ئەخلاقی‌بەرزی پێغەمبەرو ئەصحابە بەڕێزەکان بین ، هاولاَتی یەك بین ماندونەناس ، خەمخۆر بۆ خزمەتی وولاَت و موسوڵمانان بۆ حزمەتی ئیسلام، حاجی لە کاتی گەڕانەوە باوکێکی دڵسۆزبێ وەکو ئیبراهیم ، کوڕێکی بەوەفابێ وەك ئیسماعیل،

خوشکه حاجی‌یه‌کان دایکیکی ئیماندارو غه‌مخور بن بۆ ئه‌م دینه ، غه‌مخور بن بۆ پیاوو منداله‌کانیان وه‌ك هاجه‌ره ،

ئیمه ده‌چین بۆ مه‌دینه تا مه‌ده‌نی بین ، ده‌چینه خزمه‌ت رسول الله تا موحه‌مه‌دی بین ، ده‌چینه‌حه‌ج تا ئیبراهیمی بین ، ده‌چینه مالی خوا تاکو ره‌ببانی بین .

هه‌روه‌ها ئه‌و ره‌وشته به‌رزانه ئه‌و زانیای‌یانه ئه‌و تێ گه‌یشتنه له دینی‌خوا ، به‌دیاری و به‌خه‌لات بۆ موسولمانان بێ نینه‌وه .

له‌و سه‌فه‌ره فیر ده‌بی چۆن حه‌زره‌تی إبراهیم ئه‌و که‌عبه‌ی به‌رز کردۆته‌وه خوا ده‌فه‌رموی ( وإذ یرفع إبراهیم القواعد من البیت وإسماعیل ) البقرة ١٢٧

ئه‌گه‌ر له‌م حه‌جه فیری ئه‌صلی دین نه‌بی، فیری برایه‌تی ته‌بایی‌و یه‌ك ریزی موسولمانان و فیری به‌خشین و یارمه‌تی‌و خۆبه‌خت کردن و شه‌ونخونی نه‌بی، فیری نویژی جه‌ماعه‌ت و شه‌و نوێژ نه‌بی، ئه‌گه‌ر لێره تێ نه‌گه‌ی و پێ نه‌گه‌ی‌و نه‌زانی، ئه‌گه‌ر لێره فێری ئارام گرتن و نه‌رم و نیان و له‌سه‌رخۆ نه‌بی.... که‌ی فێر ده‌بی‌و که‌ی‌ده‌زانی ؟، ئینجا به‌ته‌مای له کوێ تێ بگه‌ی‌و پێ بگه‌ی و له کوێ‌ی‌تر بزانی‌و فێربی ؟! .

بۆیه مه‌لێن سالی داهاتوو ده‌چم بۆ حه‌ج ، ئه‌م سال سه‌رقالم له‌به‌ر ئیشم ، کارم ، دوکانم ، کارگه‌که‌م ، وه‌زیفه‌م

یان سەرقالْم بە مالْ و منالْ ، چۆن دەزانی تۆ بۆ سالْی داهاتوو دەمینیی یان پارەکەت ناڕوا  یان نەخۆش ناکەوی هەروەها یان ڕێگات پێ دەدرێ ، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ ( حجّوا قبل أن تَحجُّوا ) . واتە حەجی مالْی خوا بکە پێش ئەوەی ڕێگات لێ بگیرێ .

لەخوای گەورە دەپاڕێینەوە حەجی مالْی خوا هەر ئاوەدان بێ ، موسولْمانان هەر لە خۆشیدابن . تکایە دوعای خێرتان لە شوێنە پیرۆزەکان بەبەردەوامی بۆ گشت موسولمانان ، خوای گەورە گشت ئیماندارێك بەو حەجە شاد بکات ، خوای گەورە حەجیگشت حاجیان قبولْ بکات و لێیان خۆشبیت و لەو کە سەش خۆشبیت ئەوەی حاجی دوعای بۆ دەکات . ئامین



## دووەم : ڕوكـنـەكانی حـەج .

١- الاحرام :

٢-وەستان لە عـەرەفە لە (نۆی ذي الحجة )

٣- تەواف ( طواف الافاضة )

٤-السعی بین الصفا والمروة

## واجبەكانی حـەج

- لە میقات ئیحرام دەبەستی

- مانەوە لە عەرەفە تاكو مەغریب

- مانەوە لە موزدەلیفە لە شەوی جەژن .

- مانەوە لە میـنا لە شەوی دووەمی سێیەمی جەژن .

- شەیتان ڕەجم كردن ( رجم الجمرات )هەر سێ ڕۆژی جەژن

- حەلق یان قەصر ( پاش فدیەیە، ئەگەر فدیەی لەسەر بێت)

-حەج و عومرە كۆتایی د ێت بە تەوافی ماڵ ئاوایی (طـواف الوداع)

## ب - العمـــــــــــرە

وەك كارەكـانی حەجـە تەنـها ئەمانـەی خـوارەوە ناكـــەی : ڕاوەستان لە عەرەفـە ، شـەو مانـەوە لـە موزدەلیفـە ، شـەیتان ڕەجم كردن و شەو مانەوە لـــە مینا .

## سێیەم : ڕێنمایی حەج و کارەکانی

پاش چەند ڕۆژێك لە شاری مەدینەی پیرۆز بەرەو شاری مەککەی پیرۆز دەکەویەڕێ ٤٠٠ کم دوورە ، بە ( میقات ) دا تێدەپەڕی لە نزیك مەدینەیە پێی دەڵێن (ذوالحلیفە) یان ( ابیار عەلی)، نینۆکت دەقرتێنی و مووی زیاد دەتاشی (سونەتە ڕیش نەتاشی ) دەست نوێژ هەڵدەگری وخۆت دەشۆی و بۆن لەخۆت دەدەی ، تەنها نەعل لەپێدەکەی و ئیحرام دەبەستی ( ئیحرام دەپۆشی ) دوو پارچە خاولی‌یە وەك ( کفن ) وایە ( إزار وَ رداء ) بۆئافرەتان جلیخۆیانە ( تەسك و جوان و تەنك و وەك جلی پیاوان ) نەبێ ...

لە هەر شوێنێك بۆ مەککە دەچی میقات هەیە ، لەناو تەیارەش پێش ئەوەی بگاتە ڕاستی میقات ئاگاداری حاجیان دەکرێ .

ئیحرام بەستن بۆ حەج لەیەکی شوال دەست پێدەکات ، نیەتەکە بەدەنگ بێت و بەم سێ شێوەی خوارەوە :

١-بە نیەتی حەج (الافراد) فدیەی لەسەر نی‌یە دەڵێ :

(لبَّیكَ اللّـهمَّ حجاً ) ئینجا بەبەردەوامی تەلبیە دەڵێی :

لبَّيكَ اللّهُمَّ لبيكْ ، لبَّيكَ لا شريك لكَ لبَّيكْ ، إنَّ الحمـــدَ والنِّعمةَ لكَ وَالمُـــلكْ ، لا شـَـريكَ لكْ .

٢-عومره (التمتع) خێرتره و فديەی لەسەره دەڵێی :

(لبَّيْكَ اللَّـــهمَّ عمرةً الىالحج ) لبَّيكَ اللهُمَّ لبيكْ .....

٣-بەهەردوكيان حەج وعومـــره (الـقران) فـد يـەی لەسـەره، دەڵێی: ( لبَّيْكَ اللَّـــهمَّ حجاً وعمرةً ) لبَّيكَ اللهُمَّ لبيكْ .....

لەكاتیاحرام بەستن كە دەڵێی (لَبَّيكَ اللـــهُمَّ لبيـــكْ ... )

ئەگەر پـارەو ماڵەكەت حـەڵاڵ بێت و نیـەتت بـۆ خـوا بێــت ، لەئاسمانــەوه وەڵامــت دەدرێتــەوه (لبَّيْــــكَ وَسَـــــعْدَيكَ )

خوانەخواستە ئەگەر بەپێچەوانەی ئەمەبیت پێت دەوترێت :

[لا لبَّيكَ ولاسعْدَيكَ الحَجُّ مردودٌعليكَ ].. خوایگـەوره بمـان پارێزێ لەو جۆره حاجیانە .

<u>حاجی لەژێر إحرام نابێت ئەمانەی خوارەوه بكات :</u>

بۆن بەكار بینی (هێندێ لە زانایان فەرموویانــە نـابێ خواردنـی بۆندار بخوات ) ، موو لێكردنـەوه ، نینـوك كـردن ، لەبـەركردنیجلیدوورلو ،كڵوریە، پێلاو، سەرداپۆشین ، داربڕیـن ، ڕاوكـردن یـان یارمـەتی ڕاوچـی ، مـــارەبڕین یـــان دلخـــوازی ، نزیـــك بوونـــەوه یـــان گاڵتـــە لەگـــەڵ خـــێزانی بە هەر جۆرێك ، دەبێ دووربیت لەشەڕە قسەو لەهەموو گوناهان .

**بەڵام دەربارەی ئافرەتی‌حاجی لەژێر إحرام نابێ ئەمانە بەکاربێنی:**

پەنجەوانە ، پێچە (النقاب) نابێ سەرو پرچی دیار بێت .

دەتوانێ : پێڵاو و گۆرەوی و جلی دووراو لەبەربکات .

ئەگەر لەوکاتی بێ نوێژ بوون ئیحرام دەبەستن تەنها تەواف ناکەن تا پاك دەبنەوە .

**لەژێراحرام بۆگشتیان دەتوانن :**

عەینەك ، سعات ، حلقە ، جانتا ، سەبوان ، نەعل ، تەك بەند ، بەکاربێنن . دەتوانن إحرام بگۆڕن وخۆیان بشۆن ،

شانەبەکار نابنن تاموویان لێ نەکەوێ .

**١ - باسی عومرە (التّمتُّع) :**

هەر لە میقاتەوە بەپۆشاکی ئیحرامەوە بەرەو مەککە دەڕۆی و تەلبیە دەڵێن ( بۆپیاوان بە دەنگ ) تا دەگەنە بەیت ، لە مەککە شوێنی خۆت دۆزیەوەو کەلوپەلەکانت دانا دەچی بۆ تەواف (طـواف العمـرة ) ، تـەواف حـەوت جـار بـەدەوری بـەیت و (حِجر اسماعیل ) دا دەسوڕێ یەوە بەپێچەوانەی سوڕانی میلی‌کات ژمێر ، تەواف لە بەرامبەر( حَجر الأسود ) دەست پێدەکات ، دەسـتت بەرزیکـەوەو ڕووت بسـوڕێنە بەرامبـەری و بڵـێ

(بِسم الله وَالله أكبر ) هەموو جار لەم ڕاستە دووبارەی بکەوە ، هەرلەوێش کۆتایی دێت ، پێویستە دەست نوێژت هەبێ تەواف بێ دەست نوێژ بەتاڵە . بزانە تۆ لەشوێنی پێغەمبەر و ئەصحابەکان بەدەوری ئەم بەیتە دەسوڕێیەوە ، زۆر قورئان بخوێنەو هەوڵدە خەتمێك بکەی ، ئەم دوعایە هەموو جار دووبارە بکەوە لەنێوان ڕوکنی یەمانی و ڕوکنی حەجەر :

( ربَّنا آتنا في الدُّنيا حَسَنةً وفِي الآخِرَة حَسَنَةً وَقِنا عذابَ النَّار)

پاشان لە پشت (مقام إبراهيم ) لەدوور دوو ڕکعات نوێژ بکە ، بچۆ بۆ خواردنەوەی ئاوی زەمزەم چەند دەتوانی ، کەمێك دەم وچاوت بە ئاوەکە تەڕکە (التضلُّـع ) ، چونکە کافرەکان دەم و چاویان پێ تەڕ ناکەن ، لەوکاتە زۆر دوعا بکە حەزرەت دەفەرموێ (مَاءُ زَمْزَمَ لِمَا شُرِبَ لَهُ) بەچ نیەتێك دوعا دەکەی خوای گەورە دوعاکە قبولْ دەکات إن شـاءالله ، پاشان دەڕۆی بۆ سەعی کردن لەنێوان صەفاو مەروە حەوت جار هاتوو چۆیە، دووری نێوانیان (٣٧٥) مەترە ، لە صەفاوە دەست پێدەکەی و لەنێوان دوو نیشانە سەوزەکە غاردانەکی مام ناوەندی دەڕۆی (تەنها بۆ پیاوان) ، زۆردوعا بکە بۆ خۆت و بۆ موسوڵمانان،

پاشـان (حلق یـان قصــر) دەکـەی (حلـق یـانی: سەرتاشـین بـەموس، قصـر یـانی: بڕینیکـەمێك لـە پرچـی سـەر، إحرامەکـە دادەنیێ و جلی ئاسایی خۆت لەبەردەکەی .

(ئەوە کاری عومرە تەواو بوو) .

کاری حاجیلەمەککە نوێژی جەماعەتە لە ماڵیخوا (البیت) کە خێرەکەی یەك بەسەد هەزارە، دەکا خێری نوێـژی زیـاتر لـە ٥٤ ساڵ ، زۆرمانەوە لە بەیت سوننەتە بەنیەتی ( الاعتکـاف) وەکو هـەر مزگـەوتێکی تـر، سـەیرکردنی بـەیت عیبادەتـە ، بزانــە مزگـەوتیش مـاڵی خودایــە ، جیاوازیەکـەی ئەوەیـە بەویسـتی موسلمانان دروست کراوە ، بەڵام بەیت ماڵی خودایەو بەویسـتی خۆی بیناکراوە بەدەستی مەلائیکەتان و پێغەمبەران ، زۆر دوعا بکە بۆ خۆت و بۆموسڵمانان و گوناهەکانت بینـەوە پێش چاوو پەشیمان بەوە، بیر بکەوە بۆ چیهاتووی تەنها بۆ ڕازی بوونـی خوای گـەورە ، تـۆ هـاتووی بـەو هـەموو گوناهانـەوەو بـەزەیی و لێبوردنی خوای گەورەش لەگونەهـەکان زۆر گـەورەترە ، بۆیـە بەمل کەچیەوە زۆر بپاڕێوە تابەر ئەو لێبوردنەی خـوای گـەورە بکەوی، کە دەفەرموێ (...اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ) (نوح ١٠)

## ب - باسی حەج و ڕۆژی عەرەفە :

سوننەتە لە ( ٨ی ذی الحجة ) بڕۆی بۆ میناو شەو مانەوە تا بەیانی ڕۆژی عەرەفە ، یان لە (٩ی ذي الحجـــة ) لەو شوێنەی تیای لە مەککە ، دەست نوێژ هەڵدەگریو خۆت دەشۆی و ئیحرام دەبەستی و نیەتی حەج دێنی بەدەنگ تەلبیە دەڵێی، (ئەوەی ئیحرامی بەحەج بەستووە هەر لە ژێر ئیحرامە)

دەڕۆی بۆ عەرەفە نوێژی نیوەڕۆ و عەسر بە( جمــع التقــديم قصراً) دەکەی ، هەوڵدە بەرەو قیبلە دابنیشی لەو خێمەی تیای تەوبەیەکی یەکجاری بکەو لە خـوای گەورە بپاڕێوەو داوای لێخۆشبوونی لێ بکەو فرمێسکی پەشیمانی بڕێژەو قورئان بخوێنەو زۆر دوعا بکە بۆخۆت و مـاڵ و منداڵ و دایك و باوك و خوشك و براو خـزم وکەس و بۆ وڵات و گشت موسوڵمانان ، دوعا بکە ئەوانیش بێن بۆ ئێرە، ئەو ڕۆژە زۆر لە ڕۆژی مەحشەر دەچی ، چونکە یەك جلیان پۆشیوەو جیاوازی نییە لە نێوان گەورەو بچوك و پاشاو گەدا، عەرەب وعەجەم و ژن وپیاو و ڕەش پێست و سپی‌پێست ، گشتیان تێکڕا یەك داواکاریان هەیە لەخوای گەورە کەلێبوردنە، لەم ڕۆژە ئەم (ذکر )ە زۆر دووبارە

بکەوە : (لاإله إلاالله وحده لاشريك له له الملك وله الحمد يحـــي ويميت بيده الخير وهو على كلّ شيءٍ قديـــر) دەمینێیتـەوە تـاکو مەغریب .پاشان دەڕۆی بۆ موزدەلیفە کارەکانت نوێـژی عیشاو مـەغریب دەکـەی بـە (جمـع التأخـــير قصراً) بـەرد کۆدەکەیتـەوە (دەتوانـی لـەميناش بـــەرد کۆبکەیتـەوە) شـەو دەمینێـیـەوەو کەمێك دەخەوی ، پاش نیـوە شـەو یـان پـاش نوێـژی بـەیانی دەڕۆی بۆ مینـا ، کارت لـە مینـا شـەیتان ڕەجـم کردنـە، ڕۆژی یەکەمی جەژن (٧بەرد ) یـەك یەکـە لـە شـەیتانیگەورە دەگری (الجمرة الكبرى أوجمرة العقبة ) لەگـەڵ هەر بەردێك دەڵێی (الله أكبر)، پاشـیخۆت دەتوانـی لـەجیاتی منـداڵ و پـیری بـێ تاقـەت و نەخۆش ڕەجم بکەی ، پاشان حەلق یان قـەصر دەکـەی حلـق یانی: سەرتاشین خێر تـرە ، حەلقەکـە پـاش فدیـەی ( العمـــرة والقـــران )ە، إحرامەکـە دادەنـێی و جلـی ئاسـایی خـۆت لەبـەر دەکەی ، ڕۆژی دووەم و سێ یەمیش پاش نوێـژی نیـوەڕۆ هـەر شەیتانیك (الجمرات الصغرى والوســـطى) بچوکەکـە و ناوەندیەکـە لەگـەڵ گەورەکـە حـەوت بـەردی تێدەگری ژمارەیـان سـێیە . کۆی ژمارەی بەردەکان ٤٩ بەردە ( ئەگەر ڕۆژی چوارەم مانەوە

کۆی ژمارەی بەردەکان٧٠بەردە) .

ئەوەی پەلەیەتی تەنها دوو شەو لە مینا دەمینێتەوە دەکا شەوی (١٠ لە سەر١١، ١١ لە سەر١٢ی ذی‌الحجـــة) یان دەکات (ڕۆژی یەکـەم ودووەم و سـێیەمی جـەژن ) پاشـان ڕۆژی سێیەمی جەژن پێش خۆر ئاوابوون مینا بەجێ دێڵی بەیەك جاری دەگەڕێیەوە بۆ مەککە تەواف دەکەی (طواف الافاضة ) و لەپشت ( مقام إبراهیم) لەدوور دوو ڕکعات نوێژ دەکەی ، ئاوی زمزم دەخۆیەوە ، پاشان دەچی بۆ ( السعی بین الصفا والمـروە ) ( ئەوە کاری حەج تەواو بوو ) .

( حجٌّ مَـبرور وَسعیٌ مَشکور وَذنب مَـغـفور ) .

ئەو حاجیەی احرامی بە (حەج یان بە القران ) بەستوە السعی بین الصفا والمروەی کردووە کاتی کە هاتووە بۆ مەککە پێویست ناکات دووبارەی بکاتەوە .

ئەو حاجیەی احرامی بەنیەتی حەج بەستووە پاش تەواو بوونی مەناسکی حەج دەبێ عومرەیەك بکات وەکوخوای گەورە دەفەرموێ :(وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ ) البقرة ١٩٦

دەڕۆی بۆ دەرەوەی مەککە بۆ مزگوتی عائیشە ( تنعیم )

ئیحرام دەبەستی و دەگەڕێیەوە بۆ طواف و السعی بین الصفا والمروة و حلق یان قصر دەکات ، وەك پێشو لە کارەکانی عومرە باسمان کرد

چەند ڕۆژێك لە مەککە دەمینیٚ یەوە ، پاشان تەوافی ماڵ ئاوایی دەکەی و (طواف الوداع ) مەککەی پیرۆز بەجیٚ دێڵی (ئەگەر چی دڵت لایەتی و ناتەویٚ بەهیچ جۆرێك بەجیٚی بێڵی هەر دەگریی و فرمێسك دەڕێژی ، چونکە ئەو چەند ڕۆژە بەیت بوویتە برادەرێکی زۆر خۆشەویستر لەهەموو کەس ) دەگەڕێی یەوە بۆ مەدینە بۆ جاری دووەم ، چەند ڕۆژێك دەمینێیتەوە پاشان بە هەمان ڕێگا دەگەریٚ یەوە بەرەو ماڵ ، بەهیوای ئەوە خوای گەورە قبولی بکات و گشت گوناهەکانت بەجیٚ مابیٚ و نەگەڕێیەوە سەریان .

## تێبینی زۆرگرنگ دەربارەی حەج و عومرە:

١- (ئەوەی بە حەج احرامی بەستوە کە دەگاتە مەککە (طواف القدوم) دەکات ، دەتوانی(السعی بین الصفا والمروه) بکات ، یان پاش مەناسکیحەج جێبەجێیان بکات ، نابیٚحلق یان قصر بکات تا کۆتاییحەج ..

٢-خوشکان دەتوانن حەبیمەنع بخۆن تاکو تەواف لەکاتی

خۆی بکەن ، لەکۆتایی حەج یان عومرە قەصر دەکەن بەقەدەر(الأُنملة) یانی: هێندی سەری گرێی پەنجە) خوشکان حلق یان له سەرنییە .

٣- ئەوەی یەکێك لە ڕوکنەکانی حەج وعومرە جێبەجێ نەکات حەج و عومرەکەی قبول نییە ، ئەوەی یەکێك لەواجبەکانی حەج وعومرە جێبەجێ نەکات دەبێ فدیە بدات ، (کوشتیەك لەمەککە سەر بڕی ) .

٤- زیارەتی مزگەوتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) لەمەدینەی پیرۆز پەیوەندی بە مەناسکی حەج نییە تەنها سوننەتێکی زۆر پیرۆزە ، ئەگەر بچی بۆ حەج چۆن ناچیتە خزمەتی ، کەس هەیە ئەو خێرە گەورەو ئەویەرەکەتە لە دەست دا ، خێری هەر نوێژێك لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) بەهەزار نوێژە .

٥- ئەوەی باسمان نەکردووە سوننەتەکانن خێرە ونەکردنیان هیچت ناکەوێتە سەر ( بۆیە باسمان نەکردووە تا لەگەڵ ڕوکن و واجبەکان تێکەڵ نەبن و حاجییەکان سەریان لێ نەشێوێ) وەك أ-الاضطباع : ڕووت کردنی شانی ڕاست لەکاتی تەواف

کردن، لایەکی ئیحرامەکە دەخەیە بن باڵی ڕاستت تا کۆتایی تواف کردن پاشان دەگەڕێنیەوە سەر شانی ڕاستە .

ب-الرمل : خۆش ڕۆیشتن تەنها سوڕانەوەی یەکەم و دووەم و سێیەم لەکاتی تەواف کردن .

ج- یوم الترویة : ٨ ی مانگ بڕۆی بۆ المنی پاشان ڕۆژی ٩ ذی الحجة بڕۆی بۆ عەرەفە .

د - پۆشاکی ئیحرامەکە سپی بێت ... ... هیتر .

٦ -جۆرەکانی تەواف ئەمانەن :

( طواف القدوم) کاتی یەکەم جار دەگەیە مەککە کە بەنیەتی حەج إحرامت بەستووە، ( سوننەتە ) .

(طواف العمرة) کاتی دەگەیە مەککە کە بەنیەتی عومرە ئیحرامت بەستووە ، ( روکنیکی عومرەیە ) .

(طواف الافاضة) یان تەوافی واجب ، کاتی گەرانەوە لە مینا و لە شەیتان رەجم کردن بۆ مەککە ، ( روکنە ) .

(طواف التطوع) هەر کاتی دەچیە بەیت دەتوانی تەواف بکەی لەجیاتی دوو رکعات نویژی سوننەت( تحیة المسجد).

(طواف الوداع) کاتی مەناسکی حەج تەواو دەبی تەوافی مال

ئاوایی دەکەیو مەککە بەجیٚ دێلی ( واجبە ) .
٧- دەتوانی خۆت بۆن خۆش بکەی پێش إحرام بەستن بەلاّم نابیٚ بۆن لە پۆشاکی ئیحرامەکە بدەی ، ( ئەگەر بۆنەکە ماوە پاش إحرام بەستن ئاساییە) .
٨- بە هیچ جۆرێك خەلك یان خۆت ئازار نەدەی بۆ جیٚبەجیٚ کردنی خێرێك یان سوننەتێك چونکە کاتی حەج خەلکێکی زۆر لە مەککە کۆ دەبێتەوە وەك :
دوو رکعات نوێژ لە پشت مقام ابراهیم ( لەدوور لەهەر شوێنێك بێت لە حەوشەی بەیت ، ناو حەرەم ، لەپشت مقام نوێژەکە قبولە إن شاءالله )، یان زیارەتی حَجرالاسود یان عومرەی زیاد ، یان بگەیە بەرزاییەکانی چیای عەرەفە... هیـــــتر .
٩- پێشنیارم بۆ حاجی پەککەوتوو ئیحرام بە حەج و عومرە (قِران ) ببەستیٚ هەر چەندە فدیەی دەکەوێتەسەر بەلاّم بەیەك جار لەروکن و واجبەکان تەواو دەبیٚ و حەج و عومرەکەی جیٚبەجیٚ دەبێت بەتایبەتی بۆ ئافرەتی زۆر بیٚتاقەت و بۆ ئەوانەی لەرێگا توشی نەخۆشی دەبن ، هەروەها ئەوانە ئەگەر هەبوو بوون واچاکە یەکێك لەگەلٚ خۆیان ببەن بۆحەج تاکو لە

ڕێگا و لە کاری حەج یارمەتیان بدەن . یـان دەتوانـن حاجیـەك لە جیاتی خۆیان بنێرن بۆ حـەج ( بـەدەل حـەج ) هـەر وەك بۆ مردوو دەبێت ئەگەر پێش مردنی حەجی لەسەر بێت .

١٠ – پێویستە حاجیەکان مانگێك پێش سەفەرکردن بۆ مـاڵی خـوا ڕۆژانـە کـات ژمێرێك بـە پـێیان بـڕۆن ، چونکـە ڕوکـن و واجبەکانی حەج وعومرە گشتی بەپـێیان ڕۆیشتنە .

١١–دیاری بۆکەس مەینە بەناوی تفەڕك ( تَبَرُّك) تەنـها ئـاوی زەم زەم تفەڕکە . تۆ هاتووی بۆ خـوا پەرستی خـۆت خـەریك مەکە بە شت کڕین ، زۆربەی شتومەك لەشـاری خـۆت باشـترەو هەرزانترە .

١٢– تکایە پاش گەڕانەوە لەحەج باسی خواردن و دارو دیـوارو نرخی کەل وپەل مەگێڕنەوە بۆ موسلمانان، هەروەها وازبێنن لـە سوێند خواردن کەدەڵێن ( بەو حەجەی تەواقم کردووە ) .

تەنها باسی چۆنیەتی حەج و عومرە بکەن و باسی ئیمان بەرز بوونەوەکە بکەن لـەو سـەفەرە پڕخـێرو بەرەکەتـە دا تـا موسلمانانی بەتوانا هـان بدرێن ئـەو فـەرزە جێبەجێ بکـەن ، خوای گەورە گشت ئیمانداریك بەو حەجە شاد بکات .

چوارەم : ١- کەلو پەلی پێویست :

(مەلێن ئەمانەی خوارەوە پێویست ناکات ، حاجی وا هەیە پارەی حەجەکەی داناوەو نایەوێ مەصروفی زیاد بکات).

ئەگەر هەبوو بووی و پارەی باشت لەگەڵ خۆت بردبوو پێویست بەهەلگرتنی ئەم هەموو کەل و پەلانەی خوارەوە ناکات، لە هەموو شوێنێ خواردن دەست دەکەوێ ، تەنها بۆماوەیەکی کەم نەبێت، ئەمانەی خوارەوە بۆ حاجی زۆر پێویستە لەگەل خۆی هەلگرێ بۆ ئەم سەفەرە : ئیحرام بۆ پیاوان، جلێکی درێژ بۆ ئافرەتان ، خاولی ، قایشی پشت، کیسەی خام بۆ کۆکردنەوەی بەرد و دانانی شتی تر ، قورئانێکی بچوك ، زانیاری تەواو دەربارەی حەج ، کتابی دوعاو ، قەلەم و دەفتەر ، قەلەم ماجیك بۆ نوسین لەسەرکەل وپەلەکان ، کیسەو گونیەی بەتاڵ ، جانتایەك لەشێوەی باولی پێشوو بێت بۆپاراستنیکەل وپەلی تیایەتی، واچاکە قفلی هەبێ ، نەعل ( ابو الاسبع )، یەك دوو سەرچەف ، ساقۆ ، چەفیە، بەرماڵ ، حەبلێکی باریك ١٠متر ، ترمس بۆچا ، بەرداغ ، قاپ و مڵاکی سەفەری ، چەقۆ ، فلچەو مەعجونی ددان، ئاوێنەو مەکینەی تراش و موسی جاهز، مقەسەکی

بچوك ، نینۆك بڕ ، لیفكه و صابوون وتایت ، پسولەی تەندروستیو دەرمان و عەینەكی تایبەت بە خۆت ، هەند ێك دەرزی و سرنج و دەرمانی تر .

ب – خواردن : وەك : گۆشت و ماسی و پەنیرو مورەبای موعەلەب ، هەنگوین ، گوێز ، مێوژ ، هێلكه و پەتاته ، شەكرو چا ، خوێ ، كەمێك نانی نوردی ، نانی هەورامی بۆ چەند ڕۆژێك ، پورتەقال و هەنارو تەماته .

چاك وایه خوارن و نەفەقەی زیاد هەلگری تا یارمەتی برا حاجی یەكان بدەی .

هەروەها چەند شتێكی تری پێویست :

بەتانیەك و بالیفەك و دۆشەكێكی تەنك ، دەبیەی پڕئاو و مەسینەو مەنجەڵێكی بچوك ، دۆلكەو تاقمی چالێنان و غازی بچوك و هیتەری كارەبا ، میكسارەی قوتووشكان ، كەمێك برنج و ساوار ، مەعجوون تەماتەی بچوك ، زەیت و پیاز ، بنیشت ، چەرەزات .

## چەند تێبینی یەکی گرنگ :

پێشینان ووتوویانە خۆپاراستن لەچارەسەرکردن باشترە (الوقایە خیر من العلاج ) .

بۆیە زۆر پێویستە ڕەچاوی پاك وخاوێنی خۆت و خواردن و کەل و پەلەکان و شوێنەکە بکەی ، بە تایبەتی دەست شوشتن بە ئاوو سابوون پێش نان خواردن و پاش نان خواردن ، هەروەها پاش دەر چوون لە ئاو دەست . دوورکەوە لەخواردن و خواردنەوەی سەرجادەکان یان دانەپۆشراوو کۆن ، چاك وایە خواردنت باش بێت (پڕلەڤیتامینات وپروتینات) کەمیش بخۆیت، خواردن و خواردنەوەی ئامادەکراو (معلب) پاکەو باشترین شتە، هەروەها دوور کەوە لە جگارە کێشان ئەگەر هەر ناتوانی وازی لێبینی ، لە شوێنە گشتی‌یەکان و لەناو سەیارە جگارە مەکێشە .

کەل و پەلەکان دەتوانرێ کەم بکرێتەوە چەند بارت سوك تر بێت باشترە ، دەتوانن بە چەند کەسێك حاجەتێك بێنن ، کەل و پەلی وا هەیە هەلگرتنی ئاسانەو لەسەفەریش زۆر پێویستە .

•

چاك وایە خواردنەكان بكەیتە چەند بەشێك بۆ ئەم سەفەرە بەم شێوەی خوارەوە ئەگەر بتوانی :

١- بەشێك بۆ كاتی ڕۆیشتن لای خۆت دانێ لە سەیارەكە سێ ڕۆژە وەك :

نانی هەورامی و هێلكە ی كولاّ و ترمس بۆ پاراستنی چای گەرم و شیری گەرم .

٢- بەشی دووەم كاتی لە مەدینە و لە مەككەی پیرۆز دەمینێیەوە .

٣- بەشی سێیەم بۆ كاتی عەرەفەو مینا ئەویش چوار ڕۆژ دەخایەنێ .

٤- بەشی چوارەم كاتی گەڕانەوەی یەك جاری ئەویش سێ ڕۆژە .

٥- پەیڕەوی ئەم خالانەی خوارەوە بكە تاكو وون نەبی كەل و پەلەكانش وون نەبن :

أ- ژمارەی سەیارەكەت بزانە و بینا سەوە و نیشانی بكە ، ناوی سەر قافلەكەش لەبیر مەكە .

ب- کەل و پەلەکان باش ببەستەو ناوی خۆت بنووسە لەسەرهەموو کەل و پەلەکانت

ج- لەگەل هاوڕێ یەکی حاجی برۆ دەرەوە، بەتەنها مەگەڕێ

د- ناو و نیشانی ئەو شوێنەی تیای و پسولەی تەندروستی ( کارتی خۆکوتان ) لەگەلٚ خۆت هەلگرە بە بەردەوامی .

هـ- پارەکەت زۆر باش هەلگرە و کەمێکی بۆ خەرجی لەژێردەست دابنێ ، چونکە لەکاتی حەج جۆرەها خەلك کۆ دەبێتەوە ، کاتی حەزرەتی إبراهیم (علیه‌السلام) بەفەرمانی خوای گەورە جێنیشین بووە لەمەککە دوعای کردووە خەلك بێن بۆ مەککە و دلٚیان جۆش بگرێ کە لەو کاتە زۆر چۆل بووە قورئان دەفەرموێ ( فَاجْعَلْ أَفْئِدَةً مِنْ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ وارْزُقْهُمْ مِنْ الثَّمَرَاتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ) (ابراهیم۳۷)

ئەو کەسەی دەچێ بۆ حەج لەپێش دا بانگ کراوە قورئان دەفەرموێ : (وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالاً وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ )(الحج۲۷) دیارە موسولمانان کە دەچن بۆ حەج خەلکانێکی خراپ و شەڕاون و جنێو فرۆش و بێ ئاگایان لەگەلە ، بزانە ئەو جۆرە حاجیانە شەیتان بانگی

کردوون، خوا بمان پارێزێ .

زۆر دوعای خێر بکەن لە شوێنە پیرۆزەکان بۆ گشت موسولمانان و بۆ بەندە (احمد مەلا عوسمان)، خوای گەورە تەبایی و برایەتی و ئاشتی و هەرزانی و خێرو بەرەکەت بڕژێنیتە سەر موسلمانان خوای گەورە حەجی گشت حاجیان قبول بکات و لێیان خۆشبێت و لەو کەسەش خۆشبێت حاجی دوعای بۆ دەکات خوای گەورە فێرمان دەکات پاش هەموو خێرێك لێی بپاڕێینەوە تا لێمانی وەرگرێ بڵێین :

( رَبَّنَا تَقَبَّلْ مِنَّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ (١٢٧) ...... وَتُبْ عَلَيْنَا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الرَّحِيمُ )(البقرة ١٢٨)

تکایە ئەگەر تێبینی تان هەبوو بەم ژمارە پەیوەندی مان لەگەڵ بکەن (٢٢٣١١٣١) ، هەرخوای‌گەورە سەهو ناکات ، هەڵەکان لەخۆمەوەیەو ئەوەی ڕاستە لە لایەن خوا وەیە، خواپاداشتی بەخێرتان بداتەوە.

(سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ(١٨٠) وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ(١٨١) وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ) (الصافات١٨٢)

## چۆنیەتی تەواف کردن ( كيفية الطواف )




تەواف لە راستی (حجر الاسود ) دەست پی دەكات و كۆتايی دێت ، كاشی یە كانی حەوشەی بـەیت و سـەربانەكان لـەو ڕاسـتە بـە ڕەنگـی تـر نیشـان كـراون ، نیشـانەی ڕونـاك لەدیوارەكان هەڵواسراوەو نوسراوە (بداية ونهاية الطواف) تاكوحاجی‌یـەكان لەهـەر شـوێنی بـن لە ناو حەرەم ، ڕاستی (حجر الاسود) بناسن و لەو ڕاستە تەواف بكەن .

## چۆنیەتی شەیتان ڕەجم کردن ( كيفية رمي الجمرات )

١ بچووکەکە ٢ ناوەندیەکە ٣ گەورەکە




یەکەم ڕۆژی جەژن : تەنها حەوت بەرد لە شەیتانی گەورە دەگری
دووەم ڕۆژی جەژن : بیست ویەك بەرد لە هەر سێ شەیتانەکان دەگری ، هەر یەکەحەوت بەرد ، بەمەرجێك بەردەکان بکەوێتە قۆرتەکان
سێیەم ڕۆژی جەژن: بیست ویەك بەرد لە هەر سێ شەیتانەکان دەگری هەر یەکەحەوت بەرد ، وەك ڕۆژی دووەم . دەگەڕێیەوە بۆ مەککە .

چوارەم ڕۆژی جەژن : بیست ویەك بەرد لە هەر سێ شەیتانەکان دەگری ، هەر یەکەحەوت بەرد ، ئەگەر لە مینا مایەوەو پەلەت نەکرد بەلام زۆربەی حاجیەکان پەلەی دەکەن و نامینێنەوە بۆ چوارەم ڕۆژ. بەردەکان دەبێ یەکە یەکە بگریە قۆرتەکان ، نابێ گشتی بەیەکجار بگریە قۆرتەکان ( شەیتانەکان ) نابێ بەتووڕەیی یەوە کارەکە ئەنجام بدەی خۆ شەیتان لەوێ نەوەستاوە ، تەنها واجبێکەو جێبەجێی دەکەی . هەروەها نابێ نەعل و بەردی گەورە لە شەیتانەکان بگری .




الملاحظات : الارضية السوداء تدل علي المبيت

نەخشەی چۆنیەتی حەج کردن لە سەرەتا تاکۆتایی